

کوماری عیراق

وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن   دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی

زنجیرەی ژمارە (١٩٢)



# گەوهەری گەرمەسێر

## فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی زاری کەڵهوڕییە

بەشی یەکەم

نعمت علی [illegible]

ا - ب - پ - ت - ج - چ - ح - خ




بەغدا ـــــ ١٩٨٨

کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرە ژمارە (١٩٢)

# گەوهەری گەرمەسێر

## فەرهەنگێکی کوردی - عەرەبی زاری گەڵهوڕییە

نعمت علی سایە

بەش یەکەم

ئا - ئە - ب - پ - ت - ج - چ - ح - خ

بەغدا ـــــ ١٩٨٨

# سەرەتا

دوای پەناکردن وە خوداو دەسمێەت دان و هان دانی برادەران دەس کردمە دانانی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی زاری کەڵهوڕی هەتا بەری چوار ساڵ ڕەوەق ڕەوەق بێ هچان و هەوڵ دانم بوَە ئێ فەرهەنگە «گەوهەری گەرمەسێر» کە ئومێدەوارم سود بەخش بوودو مێوەتی زوانە شرینەگەمان، زوانی کوردی بکا.

لە دوای جەنگی جەهانی دووەم تاکوو ئێمروو زوانی کوردی گوَەڕینێکی گەواری دیە، چ لە ڕوَی نوَسینەوەو چ لە ڕوَی ڕێزمانەوە لە لایەن زوانەوان و بایەخدەران، وە زوانەگە وە ئومێدی نواخستن و ڕەسانینیوە کاروانی ژیان دا، ئەوەیش ناکرێ ببێ دانانی زوانێگی یەکگرتگ لە گشت زارەگانی کوردی، ئومێدەوارم کە ئێ فەرهەنگە هەنگامێك بوو لەی ڕیە، ڕێی دانانی زوانێکی یەکگرتگ.

ئێ فەرهەنگە کەمێ جیاوازە لە ئەو فەرهەنگانەی کە تا ئێزگە دانریانە لە زوانی کوردی لە ڕۆی:

١ ـ ئەلف و بێ: ئەلف و بێ وەی جوورە ڕێز کریانە:

أ [ئـا، ئە ئ، ە] ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، م، ن، و، هـ، ی.

٢ ـ وشـەگانی فەرهەنگەگە لەسەر ئەلف و بێ ڕێز کریانە نەك لە سەر دەنـگ، یانی پیتی «قـەڵەو»و نەرم لە یەك جیا نەکـریانەسەوە، ئەڕا نموونە: (ڕ)و (ر)ی، (ل)و (ڵ)ی وە یەکەوە نوَسیانە.

٣ ـ پیتی «قەڵەو» وەر لە پیتی نەرم تیێ:

أ ـ «ل» گول، گوڵ.. هتد.

ب ـ «ر» پەر، پەڕ.. هتد.

جـ ـ «ی» سێ، سی.. هتد.

٤ ـ ئەگـەر هات و وشـەیەگ دوو بەش یا زیاتر بگرێگەوە لە ئاخـاوتن دا ئەوا جیـا کریـانەسەوەو شمارە لە سەریان دانریاگە، نموونە: خر ـ ١ = ١ ودای، ٢ ـ دورە.
خڕ ٢ = ١ مدور، ٢ خلیج، ٣.قادر، متمکن

٥ ـ چاوگـی فرێـزی نوَسـیـانـە ئەولـی ناوی یا کاری سەرەکیدا جوور: ١ ـ ناو: لەنـاوچوون، ٢ ـ خسن، ئەوسەر خسن.. هتد

٦ ـ دەنـگـی «وَ» جوور دەنـگـی (RUE) ە، لە فەرەنسی دا

ئەولی پیتی (واو)دا تیێ.

٧ ـ ئەگـەر هات و مانـای وشەیەگ و چاوگی لە عەرەبی دا جوور یەك بوَن ئەوا جیـایـان کریـاگەسەوە یا بە «مصدری مؤول» یا بە دەربـرینێگی تـر هەتاکو جیاوازی لە بەینیان دا نیشان بدریێ: رێز: ترتیب، رێزکردن: أن یرتب ـ عملیة التـرتیب تاکـو و خوەنـەوار یا ئەوانـەی ئێ فەرهەنگە وە کار تیـارن وە تایبـەتی ئەوانـەی کورد نین، بزانن ئەو دوو وشە لە یەك جیاوازن.

نیشانە

١ ـ (ن) ناو

٢ ـ (ر) راناو

٣ ـ [ئن] ئاوەڵکار

٤ ـ [ئك] ئاوەڵکردار

٥ ـ [چ] چاوگ

٦ ـ [سر] سەرسوڕمان

٧ ـ [أ] ئامراز

٨ ـ [ئپ] ئامرازی پرسیار

٩ ـ [ئب] ئامرازی بانگ کردن

١٠ ـ [ك] کار •

١١ ـ [در] دەربرین

١٢ ـ [پاش] پاشبەند

١٣ ـ [پش] پێشبەند

١٤ - [پپ] پریپۆزیشن
١٥ - [پو] پێوەند
١٦ - [م] مجازی
١٧ - [تم] تەماشا بکە
١٨ - [کن] کنایە

وەر لە ئەوەی کوتایی وەی سەرەتا بارم فرە سوپاسی ئەو برادەرو مامـۆستـایـانـە کەم کە کومـەك و یارمـەتیم دان وە تایبـــەتی مامـۆستـای قرودارم محسن بنی‌ویس کە هیـچ دریـخـێـــك نەکـــرد چ لە دەسـمێـــەت دانم لە نۆسین و دەرکـردنی مانـای وشـەگـان یا پەیـداکردنی وشەی کوانەو دێرین و چ لە ڕۆی ریکخسن و ڕێزکردنی وشەگەان و بابەتیان .

تصدير

بعـــد الاتكـال على الله وبمؤازرة وتشجيـع الاخـوان عزمـت على وضـــع قامـــوس كردي ـ عربـي بالـلهجـــة الكلهـوريه، وكان ثمار جهودي المتواصلة لاربع سنوات متـواليـة هي هذا القاموس الذي بين ايديكم «گەوهەری گەرمـــەسێـر» والـذي ارجـو ان يملأ جزءا من الفـراغ في المكتبة الكردية .

تشهد اللغة الكردية منذ انتهاء الحرب العالمية الثانية حركـة واسعـة من لدن اللغويين والمهتمين بشؤون اللغة بأمل تطويرها وجعلها مواكبة ومسايرة لروح العصر، وهذا

لا يتأتى الا بوضع لغة موحدة من اللهجات الكردية المختلفة، وهكذا صدرت عدة قواميس ومعاجم بلهجات متعددة ساهمت الى حد كبير في رسم صورة كاملة للغة الموحدة، لذا وجدت من الواجب ان اساهم - قدر المستطاع - في هذا الجهد العظيم والمشكور فعمدت الى وضع هذا القاموس لعله يساهم في توحيد اللغة ويزيد من رونق تلك الصورة وجماليتها.

يختلف هذا القاموس عن القواميس الكردية الاخرى التي وضعت حتى الان من الاوجه التالية:-

١ - الالف باء: وكان ترتيبها على النحو التالي:

أ [ئا، ئه، ئ، ه]ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، م، ن، و، هـ، ى.

٢ - رتبت كلمات هذا القاموس على اساس الحروف الهجائية وليست على اساس الاصوات كما هو الحال بالنسبة للقواميس الاخرى، اي ان الحروف الثقيلة والخفيفة لم تفرز وتعامل على اساس حروف مستقلة.

مثال: كتبت الحروف (ر)، (ڕ) و (ل) (ڵ) معا

٣ - كتبتُ الحرف الخفيف قبل الحرف الثقيل:

أ - ل - گول، گوڵ. . الخ

ب - ر - پەر، پەڕ. . الخ

جـ - ى - سێ، سی. . الخ

٤ ـ إذا كانت الكلمة تكون اكثر من نوع واحد من اقسام الكلام فأنها تكتب منفصلة بعد ترقيمها ١ ، ٢ ، ٣ الخ مثال: خر-١ = ١ وادى، ٢ دوره. خر ٢ = ١ مدور، خليع ، ٣ قادر، متكمن.

٥ ـ تأتي المصادر العبارية مع الاسم او الفعل الاصلي: ناو، له ناو چوون. خس ئەو سەر خسن.

**٦ ـ صوت «وَ» هو كما في الفرنسية (RUE) ويأتي هذا الرمز مع الحرف «و» واو.**

**٧ ـ تفاديا للالتباس الذي قد يقع فيه بعض القراء وخاصة من غير الكرد فقد عمدت الى استعمال مصادر مؤوله او تعابير اخرى في حالة تشابه معنى الاسم والمصدر في اللغة العربية ، لنفرق بين معنى الكلمتين او بالاخرى اقسامها مثل: رێز = ترتيب ، رێزكردن = ان يرتب ، عملية الترتيب.**

المختصرات المتعددة

١ ـ [ن] اسم

٢ ـ [ر] ضمير

٣ ـ [ئن] صفة

٤ ـ [ئك] ظرف

٥ ـ [چ] مصدر فعل

٦ ـ [سر] اداة التعجب

٧ ـ [أ] اداة
٨ ـ [ئپ] اداة استفهام
٩ ـ [ئب] اداة نداء
١٠ ـ [ك] فعل
١١ ـ [در] تعبير
١٢ ـ [پاش] لاحقة
١٣ ـ [پش] سابقة
١٤ ـ [پپ] حرف جر
١٥ ـ [پو] حرف عطف
١٦ ـ [م] مجاز
١٧ ـ [تم] انظر
١٨ ـ [كن] كنايه

ويسرني ان اختم هذا التصدير بتقديم جزيل شكري وامتناني لجميع الاخوان الذين ابدوا لي العون والمساعدة سواء بالبحث عن الكلمات النادرة ومعانيها او بتزويدي بمصادر ومراجع عن الموضوع واخص بالذكر زميلي محسن بني ويس الذي لولاه لما تمكنت من انجاز هذا القاموس. والله من وراء القصد.

سەرچاوە

١ ـ قاموسی زمانی كوردی، بەرگی یەكەم (ء) عبدالرحمن محمد امین زەبیحی

٢ ـ قاموسی زمانی كوردی، بەرگی دووەم (ب)

عبدالرحمن محمد امين زەبیحی
٣ ـ فەرهەنگی لەك ولوڕ، دانان وکۆکردنەوەی حەمیدی ئێزەد پەناهـ.
لێدوان وبەراوردکردن مەحموود زامدار.
٤ ـ ئەستێرە گەشە، فاضل نظام الدين.
٥ ـ المورد ـ قاموس انگليزي ـ عربي، تأليف منير البعلبكي.
٦ ـ المنجد في اللغة والاعلام.
٧ ـ فقه اللغة للثعالبي.

٨ ـ The Advanced Dictionary.

By A.S.Hornby and others

London. 1967

ـ أ ـ

أ [ن] ـ ئەلف ـ الحرف الاول من الالف باء

ار [پاش] تضاف الى الفعل الماضي لتكون اسم : كوشت: كوشتار

ان [پاش] ١ ـ علامة الجمع : منالّ: منالّان

٢ ـ تضاف الى الاسم لتكون اسم لعبة : كلّاو: كلّاوان.

٣ ـ تضاف الى الاسم لتعني السلالة : باوگه : باوگان : له دالّگانەو قەومن. تضاف الى العدد فتكون بدل : چەن ؟ چواران.

ئا [ن] نعم، اي : ئەحمەد ها لە مالّ؟ ئا.

**ئاب** [ن] شهر آب: الشهر الثامن من السنة الميلادية.
**ئابووری ۱** [ن] اقتصاد.
**ئابووری ۲** [ئن] اقتصادی: کاروباری ئابووری.
**ئابـونـه** [ن] بدل اشتراك شهري اوسنوي يدفعه اعضاء المنظمات والاحزاب والجمعيات.
**ئاتەشە** [ن] مرض الجذام.
**ئاتەشەدار** [ئن] المصاب بمرض الجذام.
**ئاج** [ن] خشب العاج، شجرة العاج،
**ئاجان** [ن] انضباط الشرطة.
ئاجوَل [ن] کرزات.
**ئاچەر** [ن] قداحة: ئاچەرەگەی دەرکردو دەمی جغارەگەی دا.
**ئاخ** [سـر] صرخـة التألم والتـوجـع والحسرة. ئاخ مردم! ئاخ لەی کارە!
**ئاخـر** [سـر] ۱ ـ للتعبير عن الاستغراب والانزعاج! ئاخر ئەرِا نەهات!
۲ ـ للموافقة على رأي المقابل:
ـ ئەگەر ئەو قەبوول بکردا ئەوا لیمان نەهات.
ـ ئاخر!
**ئاخر ئوخر** [ن] نهاية او الايام الاخيرة من شيء.
**ئاخرەت** [ن] ۱ ـ يوم الاخرة، القيامة
۲ ـ نتيجـة، عاقبـة ۳ ـ اخيـرا في النهـاية: ئاخرەت ماڵ

ماڵی خوەیه .

ئاخر كردن [چ] الازالة ، الافناء : دنیا ئاخر مەكە .

ئاخڵ [ن] ۱ ـ كومه كبيرة من الحطب ۲ ـ هاله حول القمر

ئاخڵ دان [چ] تشكيل هاله (القمر) حول نفسه . مانگ ئاخڵ داگه

ئاخ و داخ [ن] التألم والتحسر المستمر . ئاخ و داخ له دەست!

ئاخوڕ [ن] ۱ ـ معلف للحيوانات ۲ ـ منهل للحيوانات الاليفة .

ئاخون [ن] ملا او عالم ديني .

ئاخين [ن] توجع ، تألم ، تحسر .

ئاخين و داخين [ن] توجع ، تألم ، تحسر مستمر .

ئادەم [ن] ۱ ـ آدم : الاب الاول للبشرية ۲ ـ بشر ، انسان . ۳ ـ بشرية ، انسانية .

ئادەميزاد [ن] ۱ ـ ابناء ادم ۲ ـ بشرية ، انسانية .

ئاراسه [ن] ۱ تصويب ۲ توجيه ، ارسال ،

ئاراسه بوون [چ] ۱ ـ التصويب ۲ ـ التوجيه

ئاراسه كردن [چ] ۱ ـ التصويب ۲ التوجيه ، الارسال .
خودا دەردێ ئەڕایان ئاڕاسه كێگ .

ئارام ۱ [ن] ۱ ـ استقرار ۲ ـ سكون ، هدوء ۳ ـ صبر .

ئارام ۲ [ئن] ۱ خفيف ۲ هادیء

ئارام گا [ن] ۱ ـ الاستقرار ۲ ـ السكون ۳ ـ الصبر ، الاصطبار ،

**ئارام لێ برین [چ] جعله يفقد الهدوء والصبر.**
سەرزان ئارامە لێ بریە.
**ئارەزوو** [ن] ١ ـ رغبة، امل ٣ ـ رغبة
**ئارەزووکردن** [چ] ١ ـ الرغبة ٢ ـ الامل
**ئارەما** [ن] مخاض (خاص بالحيوان)
**ئارەماکردن** [چ] المخاض: سێ چوار بزنم ئارەما کەن.
**ئارد** [ن] ١ ـ طحين ٢ ـ مسحوق، سحيق
أ ـ وە ئاردبوون [چ] الانسحاق: لەبان دیوارەگە کەفتەو خوارو یەك دەسی بوە ئارد.
ب ـ وە ئاردکـــردن [چ] السحق: پەرداخـەگـە کوتـاوە زەوَاو کردەی وەئارد.
**ئاردین** [ئن] ١ ـ طحين ٢ ـ خاص بالطحين، نسبة الى الطحين.
**ئاروو** [ن] لثه: ئاروو بانگم سافا بوە.
**ئاز** [ن] قوه، مقدره: ئاز لە تێ ی نەماگە.
**ئازا** [ئن] ١ ـ متعافی: سەرووەر چوَنە؟ ماشەللا ئازاسە.
٢ ـ شجاع: باوگی فرە ئازا بوَ. ٣ ـ کامل: سێ نانی ئازا خوارد.
**ئازابـوونـەوە** [چ] ١ ـ الشفاء: بەرزوو لە نەخوەشیەگەی ئازا بوەو ٢ ـ العودة الى الحالة الطبيعية.
**ئازاد** [ئن] حر، طليق، غير مقيد.

**ئازادکردن** [چ] التحرير، العتق، التخليص.
**ئازادی** [ن] ١ ـ حرية ٢ ـ خلاص.
**ئازار** [ن] ١ ـ الم ٢ ـ عذاب
**ئازاردان** [چ] ١ ـ الايلام ٢ ـ التعذيب
**ئازکردنەوە** [چ] ١ ـ الاشفاء: خودا هەر ئازادان بکێگ.
٢ ـ الاعادة الى الحالة الطبيعية: مردبوَ، کتور ئازای کردەوە.
**ئازایەتی** [ن] شجاعة، اقدام: ئازایەتی لە ئێمانە.
**ئازایی** [ن] ١ ـ شجاعة، اقدام ٢ ـ حالة الكمال.
**ئازەو** [ئـن] اعزب، عزباء: : سیٚ کــوڕی ژن دارنٚ و دووانی ئازەون..
**ئازەوانـە** [ن] المبلغ الـذي يدفع لرجل غير المتزوج عند انفصاله عن اخوته.
**ئازەو پیٚ هاتن** [چ] استــرداد القـوة والقـدرة: نان خاس بخوە تا ئاز بێی ئەوپیت.
**ئازەو پیٚ هاوردن** [چ] جعله يسترد القوة والقدرة: نانەگە کەمیٚ ئاز هاوردەو پیمان.
**ئازەوی** [ن] عزوبية.
**ئازووقـە** [ن] ١ ـ تمـوين ٢ ـ ما يخـزن من مواد غذائيـة لفصل الشتاء: ئازووقەی ساڵیٚ ئەڵگرتنە.
**ئازیەت** [ن] عزاء، حداد: لە چل ڕووژ زیاتر ئازیەتٚ حەرامە.

**ئازیەتبار** [ئن] متعزي ، لبس السواد عزاء : ئەڕا باوگی ئازیەتبارە .
**ئازیــەت گرتــن** [چ] الــتعــزي ، لبس الســواد عزاء : ئەڕاکوڕەی ئازیەت گرتگە .
**ئازیەتی** [ئن] خاص بالعزاء .
**ئازیکە** [ن] نبات شوکي .
**ئاژ** [ن] ملاة ، خیاطة اعدادیة
**ئاژاوە** [ن] فوضی ، اضطراب ، فتنة .
**ئاژاوەنـانـەوە** [چ] اثارة الفوضی والاضطراب والشغب : بەسە ، کەم ئاژاوە بنەرەوە .
**ئاژاوەونەر** [ئن] فوضوي : مەردمەگە ئاژاوەونەرن .
**ئاژەڵ** [ن] الحیوانات الالیفة وخاصة الاغنام .
**ئاژدان** [چ] الملاة : ئاژی باڵ شەوەگە ئەڕام دا .
**ئاژن** [ن] ١ ـ طعــن : خنجــەر ئاژ ن ٢ ـ غرز : دەرزی ئاژ ن . لا تأتي هذه الکلمة لوحدها وانما مع کلمة اخری کما ورد اعلاه .
**ئاس** [ن] انزعاج ، ضیق ، مضایقة : فرە ئاسم لەی کارە .
**ئاسا** [ن] ١ ـ مثل ، منوال ٢ ـ عادە ، منهج : باوگی ئاسا کەللە ڕەقە .
**ئاسـات و ئابـات** [سر] للدلالة علی نفاذ الشيء او انتهاء الشيء ، هەر ئەو پێنج دینارە ماگە : دی ئاسات و ئابات !

**ئاساره** [ن] ١ ـ نجم ٢ ـ طالع
ـ ئاسارەی داجۆریا [در] مات، توفی .
**ئاسان** [ئن] ١ ـ سهل ٢ ـ بسيط .
**ئاسان بوون** [چ] ان يصبح سهلا او بسيطا : كار نی یه ئاسان نەبوو.
**ئاسان كردن** [چ] ١ ـ التسهيل ٢ ـ التبسيط
**ئاسای** [تم] ئاسا .
**ئاسايی** [ئن] ١ ـ اعتيادي ٢ ـ مألوف
**ئاس بوون** [چ] الانزعاج، الشعور بالضيق : له گيانی خوەيان ئاس بوَنه .
**ئاسقی** [ن] رباط الجوارب .
**ئاس كردن** [چ] الازعاج، المضايقة : ئاسمان له گيان كردن .
**ئاسك** [ن] غزال وخاصة الصغار.
**ئاسمان** [ن] ١ ـ سماء ٢ ـ قضاء ٣ ـ علياء .
أ ـ ئاسمان گيری (م) تمطر السماء .
ب ـ ئاسمان لچ ناگه له زەوَ (م) السماء حبلى وعلى وشك ان تمطر.
جـ ـ له ئاسمان چوون (چ) الارتفاع، الاعتلاء : داره تەرگەزەگه چگه له ئاسمان .
**ئاسمانی** [ئن] ١ ـ سمائي ٢ ـ فضائي ٣ ـ خاص فيما يتعلق بالسماء والفضاء

**ئاسن** [ن] ١ ـ حديد ٢ ـ (م) صلابة: گیانی ئاسنه.
**ئاسن رەوا** [ن] مغناطیس.
**ئاسنگەر** [ن] حداد.
**ئاسنگەری** [ن] حدادة.
**ئاسنین** [ئن] ١ ـ حدیدي ٢ ـ (م) قوي.
**ئاسوو** [ن] افق: هیچ له ئاسوو دیار نی‌یه.
**ئاسووده** [ئن] ١ ـ سعید، مرتاح ٢ ـ معتوق
**ئاسووده بوون** [چ] التخلص، التحرر: هەر بایەته مللەت له چنگی زوڵم و زوورداری ئاسووده بوود.
**ئاسوودەکەر** [ن] محرر، الذي یجدد الاخرین من الشدة كالعبودیة والضیق الاقتصادي
**ئاسوودەکردن** [چ] ١ ـ التحلیص، التحریر ٢ ـ العتق: کەی خودا ئاسوودەمان بکێ له دەس زووردار.
**ئاسوودەیی** [ن] ١ ـ خلاص، عتق، انعتاق ٢ ـ سعادة.
**ئاسیاو** [ن] طاحونة مائیة.
**ئاسیاو بێ ئاو نانەوه** [کن] اثارة مشاکل لا مبرر لها: ئەوه چەسه ئاسپاو بێ ئاوێ نایەنسەوه!.
**ئاسیاو کردن** [چ] الطحن بالمطحنة المائیة.
**ئاش** [ن] ١ ـ اكلة الرز ٢ ـ مطبوخات بصورة عامة، طعام.
**ئاشپاڵۆ** [ن] مصفاة الرز والحبوب الاخرى.
**ئاشپەس** [ن] طباخ، الذي یقوم بالطبخ، طاهي.

**ئاشپەسخانە** [ن] مطبخ ، مطهى .

**ئاشت** [ن] ١ ـ صداقة ، مودة ٢ ـ صلح ، سلام .

**ئاشت بوونەوە** [چ] التصالح : دوای سیّ سالْ جەنگ ئاشت بونەوە .

**ئاشت کردنەوە** [چ] الاصلاح ، اصلاح ذات البين .

**ئاشتی** [ن] صلح ، سلام .

**ئاشکرا** [ئن] ١ ـ ظاهر ٢ ـ واضح ، بیّن : ئاشکرایە ، ئەوان ناهەقن .

**ئاشکرابوون** [چ] ١ ـ الظهور ٢ ـ الوضوح ، التبيان : هەر رووژێ تیێ ئێ کارە ئاشکرا بوو.

**ئاشکرا کردن** [چ] ١ ـ الاظهار ٢ ـ التوضيح .

**ئاشنا** [ن] معارف ، اصدقاء .

**ئاشنا بوون** [چ] التعارف ، المصادقة .

**ئاشنایی** [ن] معرفة ، صداقة .

**ئاغا** [ن] سيد القوم ، كبير القوم .

**ئاغایەتی** [ن] ١ ـ سيادة ٢ ـ مهنة الآغه .

**ئاغە** [تم] ئاغا

**ئاغەمیرەو** [ن] اراجيز حداد على الميت .

**ئافەتە** [ن] وباء ، طاعون .

**ئافەرم** [سر] احسنت! ئافەرم ، دەسد خوەش!

**ئافەرین** [تم] ئافەرم .

**ئافرەت** [ن] ١ ـ امرأة ٢ ـ نساء

**ئافرەتانە** [ئن] ١ ـ نسائي ٢ ـ خاص بالنساء.
**ئاقڵ** [ئن] ١ عاقل ٢ ـ حكيم ٣ ـ دارك.
**ئاقڵ بوون** [چ] ١ ـ التعقل ٢ ـ التأدب
**ئاقڵی** [ن] ١ ـ تعقل ٢ ـ استدراك الامور.
**ئاقڵی کردن** [چ] التصرف بعقلانية: ئاقڵی کرد دەسی خوەی نەکردە ئیٚ شەڕا.

**ئاقوڵ** [ن] نبات العاقول.
**ئاقوڵین** [ئن] كثير العاقول.
**ئاگا** [ن] ١ ـ علم، خبر، ٢ ـ انتباه.
**ئاگادار** [ئن] ١ ـ عالم، عارف، مطلع ٢ ـ منبّه، مُبلّغ، متيقظ، متحذر.
**ئاگادارکردن** [چ] ١ ـ الاعلام، الاخبار، التبليغ، الاطلاع ٢ ـ التنبيه، التحذير.
**ئاگاداری** [ن] حالة كون الفرد منبه، عالم، عارف، ، مطلع، مبلغ، محذر.
**ئاگر** [ن] ١ ـ نار ٢ ـ انفعال ٣ ـ حماسة ٤ ـ غضب ٥ ـ حريق.
ـ ئاگر لە بان زگ کیٚگەو [در] ينكر، يتبرأ من.
**ئاگرە** [ن] مرض جلدي يتصف بالحرقة.
**ئاگرەکەوڵ** [ئن] محترق محبة او خوفا: ئاگرە کەوڵی کوڕەگانی یە.

ئاگره کەوڵ بوون [چ] الاحتراق محبة او خوفاً.
ئاگرەو کوش [ن] ١ ـ مطفأة: الة الاطفاء ٢ ـ رجال الاطفاء.
ئاگر بەرەك [ن] يُراعه، حُباب.
ئاگر بوونەوە [ن] اشتغال النار من جديد.
ئاگــردان [چ] الاحـراق، الاشعـال: ناکـەس، ئمشـەو ئاگری خەرمانەگەیان دا.
ئاگــر کردنـەوە [چ] اشعـال النـار: سەردمـانـە، ئاگـرێ ئەرامان بکەرەوە.
ئاگر لێ چوون [تم] ئاگر گرتن.
ئاگرئانەوە [چ] اشعال الفتن، اثارة الفتن والقتال.
ئاگرو دوَ [ن] محروقات.
ئاگری [ئن] ١ ـ ناری ٢ ـ جنسي: ژنی ئاگری ٣ ـ مثير للغريزة الجنسية.
ئاگرين [ئن] ١ ـ ناری ٢ ـ نەرش خانی [چ] کوڕ ئاگرین دێری!
ئاڵ [ئن] احمر قاني.
ئاڵەت [ن] فلفل، کرکم.
ئاڵەتی [ئن] حاد الطبع: کابرایەگی ئاڵەتی یە.
ئاڵت [ن] نقص، نقیصه.
ئاڵت هاتن [چ] التقاصر: چەن کێلو ئاڵت هات؟
ئاڵتوَن [ن] ١ ـ ذهب ٢ شيء ثمين [م].



ئالْنگ [ن] جغد.

ئالْنگ هاتن [چ] التجغد: ئالنگ وەر ڕانی هاتگه.

ئالو بالو [ن] عنجاص، شجرة العنجاص.

ئالوَچه [ن] عجينة مدهنة يمسح بها وجه الطفل.

ئالوَچەدان [چ] ١ ـ مسح وجه الطفل بالمادة السابقة ٢ ـ الدبغ.

ئالی [ن] ١ ـ تبليغ، ابلاغ ٢ ـ معرفة، شعور بشيء.

ئالْی [ن] كون اللون احمراً قانياً.

ئالی بوون [چو] الاستشعار، التعلم، التعرف.

ئالْیشت [ن] ١ ـ تبديل ٢ ـ تغيير ٣ ـ تبدل.

ئالْیشت بوون [چ] ١ ـ التغيير: ڕەنگی ئالْیشت بوَه ٢ ـ التبدل: ـ

قەلْمەگەم ئالیشت بوَ ئەول قەلْەمێگی ترا

ب ـ ئالْیشت كردن [چـو] ١ ـ التغييـر: نەخوەشی ڕەنگی ئالْیشت كردگه ٢ ـ التبديل: ئالْیشتی ئەسپەگەی كرد وه ماهینیْ.

جـ ـ ئالْیشت و لْیشت [ن] تبادل وتغير مستمر

ئالی كردن [چ] ١ ـ الابلاغ، الاشعار، الاعلام ٢ ـ التنبيه

ئاماده [ئن] ١ ـ مستعد، متأهب ٢ ـ جاهز، حاضر

ئامـادەبـوون [چ] ١ ـ الاستعداد، التأهب. ٢ ـ ان يصبح جاهزا او حاضرا



**ئامادەکردن** [چ] ١ ـ الاعداد ٢ ـ التجهيز، التحضير
**ئامـــادەیی** [ن] ١ ـ الاستعـــداد، التأهب ٢ ـ حالـة كون الشيء حاضرا او جاهزا
**ئامار** [ن] احصاء، علم الاحصاء.
أ ـ ئامار کردن [چ] الاحصاء
**ئامانەت** [ن] ١ امانة: ئەو سەت دینارە ئامانەتە لە لاد
٢ ـ توصية: ئامانەتی کوڕە بکە هۆریانە پێەوە بوو
**ئامـانـەت دان** [چ] التوصية، التكليف: سامی ئامانەتی کتاوێ داگەسە پیم.
**ئامووزا** [ن] اولاد الاعمام
**ئامێتە** [ن] مزيج، خليط.
**ئامیتەبوون** [چ] الامتزاج، الاختلاط.
**ئامیتەکەر** [ن] خباط، الة لخلط المواد
**ئامیتە کردن** [چ] المزج، الخلط
**ئامین ١** [سر] ١ ـ آمين: خودایا سترمان بکە، ئامین!
٢ ـ لیکـون کذلـك: هەرکـەس منەی گەنی کێگ کورێ بمرێ: ئامین!
**ئامیـــن ٢** [صَ] ١ ـ امیـن: من فرە ئامـینم لێـــان ٢ ـ مطمئن: ئامین بوو کوڕەگەت سەلامەتە
**ئامین و ڕوین** [ن] الامن والاطمئنان
**ئانە ١** [ن] عانه، عملة عراقية تساوي اربعة فلوس.
**ئانە ٢** [ك] ١ ـ خذ ٢ ـ تفضل

ئانـديـده [س] آمين! ماڵد برمێ ئانديدەوئامين. لا.تأتي هذه الكلمة لوحدها وانما مع كلمة ئامين كما جاء اعلاه

ئاو [ن] ١ ـ ماء: نيشـانـەی ئاوسەونـزیـیـە ٢ ـ عصيـر: ئاوی ئەنــار. ٣ ـ سائـل ٤ ـ معجـون ٥ ـ لعـاب: ئاوی دەمی هات

أ ـ ئاوی چەرمگ [ن] ماء ابيض يتكون في العين بسبب مرض

ب ـ ئاوی ژێر کەی [در] فتان: برِوا پێ مەکە، ئاوی ژێر کێیە.

جـ ـ ئاوی سيه [ن] ماء اسود يتكون في العين بسبب مرض

د ـ ئاوی مرواری [ن] الماء الزجاجي

هـ ـ ئاويان وه يەك جووا نيه چوو [در] لا يتفقون

و ـ ئاو له ئاو تەكان نيەوەی [در] كنايه عن الاستقرار والضبط.

ز ـ له هەفت ئاو داگە قاپی تەرِ نەبوَه [در] حيّال

ح ـ وه ئاوا دان [چ] انْ يلقـي في المــاء ٢ ـ ان يهــدر: هەرچگ کرد دايەی وه ئاوا

ئاوا [ن] ١ ـ غروب: جارێ خوەر ئاوا نەبوَه

٢ ـ اختفاء: له چەو ئاوا بوَ

٣ ـ عمران: هەرکەس وەر چەوی تێره خودا ماڵی ئاوا بکێگ.

**ئاوا بوون** [چ] ١ ـ الغروب ٢ ـ الاختفاء ٣ ـ العمران، التعمير ٤ ـ الافوال.
**ئاوات** [ن] ١ ـ غاية ٢ ـ امنية
**ئاواره** [ئن] ١ متشرد، شريد ٢ ـ تائه، ضائع
**ئاواربوون** [چ] ١ ـ التشرد ٢ ـ التيه، الضياع
**ئاواره‌كردن** [چ] ١ ـ التشريد ٢ ـ التضييع، سلب الاخرين مساكنهم وتركهم في العراء.
ج ـ ئاواره‌یی [ن] ١ ـ تشرد ٢ ـ تيه
**ئاواز** [ن] ١ ـ نغمه ٢ ـ لحن ٣ ـ تجويد
**ئاوا كردن** [چ] التعمير، التنميه
**ئاوای** [چ] ١ ـ قرية ٢ ـ ريف ٣ ـ معمورة
**ئاوه‌خت** [ن] امل، امنية
**ئاوه‌خت خواز** [ئن] متأمل، متمن
**ئاوه‌دانی** [ن] ١ ـ عمران ٢ ـ تحضر
**ئاوه‌دان كه‌ر** [ن] معمر، مصلح
**ئاوه‌دانی‌كردن** [چ] الاصلاح، التعمير، القيام بالاصلاح والتعمير.
**ئاوه‌ره** [ن] ١ اهمال: ئاوه‌ڕی بكه پیاگ نی‌یه ٢ ـ بعدا: ئاوه‌ره لێ كوڕه.
**ئاوه‌ره‌كردن** [چ] الاهمال، الترك، الابعاد
**ئاوه‌زا** [ن] نزيز: زه‌وه‌گه بوه وه ئاوه‌زا،
**ئاوه‌كین** [ئن] ١ ـ خفيف: چای ئاوه‌كین ٢ ـ خاص

بالسؤال: خواردنی ئاوەکین

**ئاوەلەمە** [ن] جنین

**ئاوەن** [ن] هاون، مهراس ر،

**ئاوبەن** [ن] مرض الاستسقاء

**ئاو بەن کردن** [چ] الاصابة بمرض الاستسقاء

**ئاوپاهاتن** [چ] الشعور بالتعب الشديد: ئەوقەرە وسام وەپاوە ئاو پام هات.

**ئاو جوو برەك** [ن] ١ ـ طير الماء، طير سابح او مخوض ٢ ـ كناية عن التنقل السريع وعدم التوقف: چەدە، هەر تێیدو هەرچید، ئاوجوو برەکید؟

**ئاو چەو سەنن** [چ] ١ ـ الارعاب ٢ ـ السيطرة بالتخويف: زاڵمە، ئاوچەویان سەنگە

**ئاودان** [چ] الارواء: جی دوو وەزنە گەنم ئاو دام.

**ئاو دەر** [ن] السقّاء: زووراو ئاودەری قاوەخانەس

**ئاودەس** [ن] غائط

**ئاودەسخانە** [ن] مرفق صحي، مرحاض، ميزاب

**ئاودێز** [ن] التهاب الجرح بسبب غسله اورش الماء عليه

**ئاودێزکردن** [چ] ان يلتهب الجرح بسبب الماء.

**ئاورێژ** [ن] مجرى الماء من الاماكن العالية كالجبل

**ئاورێژگە** [تم] ئاورێژ

**ئاوروَ** [ن] شرف، كرامة، سمعة، اعتبار

**ئاوروَبردن** [چ] الاهانة، التحقير، الاذلال، انتهاك

الكرامة : ئێدی واز بار ئاوڕوَمان بردی

**ئاوڕوَچوون** [چ] فقدان الشرف، السمعة، الكرامة.

**ئاوڕوَدار** [ئن] شريف، ذوكرامة واعتبار

**ئاوڕوشكەره** [ن] قمص: ذبان صغير يجري بحركة دوامية على سطح الماء الراكد.

**ئاوس** [ئن] حبلى، حامل [للحيوان]

**ئاوس بوون** [چ] الحبل، الحمل: مانگا هوَل ئاوس بوَه.

**ئاوس كردن** [چ] التحبيل

**ئاوسی** [ن] حالة الحبل او الحمل

**ئاو كردن** [چ] ١ ـ التدمع [عين] بسبب الالم اووقوع شيء غريب فيها ٢ ـ نضح [اللعاب او السوائل]

**ئاوگرتن** [چ] استخراج العصير من: ئاوی چوار پرتقاڵ ئەرامان بگرە

**ئاوڵ** [ن] ١ ـ احد ٢ ـ معيل: بێ ئاوڵ وساوڵ.

**ئاوڵڵه** [ن] مرض الجدري

**ئاونگ** [ن] ندى

**ئاونگ نان** [چ] التندى: دوَشەو فره ئاونگ نابوَ.

**ئاوهار** [ن] وكاء، حبل يستعمل لحمل قرب الماء

**ئاووهەوا** [ن] ١ ـ الجو ٢ ـ حالة الجو من رياح وامطار وغيرها

**ئاوی** [ئن] ١ ـ سيحى ٢ ـ خاص بالزراعة السيحية

**ئاوێاری** [ن] سقي

**ئاوێاریکەر** [ن] ساقي المرزوعات

**ئاوێاریکردن** [چ] الاسقاء: احمد، چەکێک لە ..

خەلێەگە؟ ـ ئاوێاری کێگ.

**ئاوێانی** [تم] ئاوەدانی

**ئاوێانیکەر** [تم] ئاوەدانیکەر

**ئاوێانی کردن** [تم] ئاوەدانی کردن

**ئاوێنەك** [ن] ١ ـ زجاج لامع ٢ ـ مرآة

**ئاهـ** [سر] االتعبير عن الحسرة والالم: ئاهـ! دەسم بێ دەسڵاتە!

**ئاها** [سر] التعبير عن الرضا: ئاها! ئێرنگە فرە خاسە!

**ئاهەنگ** [ن] ١ ـ حفلة ٢ ـ مهرجان

**ئای** [سر] تعبير عن الالم والحسرة: ئای لە دسد!

**ئاێەم** [تم] ئادەم

**ئاێەمی** [ئن] آدمی، انسانی

**ئاێەمێانە** [ئن] خاص بالانسان: کاری ئاێەمێانە

**ئاێەمیکردن** [چ] الاحسان: ئاێەمی بکە شوونمان بکرەوە.

**ئاێری** [ئن] ١ ـ منفصل ٢ ـ محدد: بەشەگەی من ئاێری‌یە.

**ئاین** [ن] دین، عقیدة، ایمان

**ئاینەمەرگ** [ئن] ١ محتضر ٢ ـ کنایة عن الحرکة

**ئاینی** [ئن] دینی ، ذو علاقة بالدین
**ئه** [پش] تضـاف الی الفعـل لتـدل علی المضـارع :
ئه‌چم : ئه‌کەم
**ئه‌بەد** [ئك] ابدا ، قط : ئه‌بد وه ئی قسه قه‌بوول نیه‌کەم .
**ئه‌بەدی** [ئن] ابدي ، ازلي ، سرمدي
**ئه‌برو و** [ن] حاجب العین : لیٚ هوون بەرەو هوون ئه‌برو و قه‌ڵەم کەش [فولکلور] .
**ئه‌ت** [ن] ۱ ـ ضرب ۲ ـ صفعة [للطفل]
**ئه‌تەوه** [ن] ۱ ـ سبب ، علە ۲ ـ عتاب
**ئه‌ترەش** [ن] رعب
أ ـ ئه‌ترەش بردن [چ] الارعـاب : کەم هاوار بکە ئه‌ترەش منالّەگان بردی .
**ئه‌ت کردن** [چ] الضرب ، الصفع (طفل)
**ئه‌جـاب** [ن] حیـاء ، شرف ، کرامـة : بیٚ ئه‌جـابە ، هیچ شەرم لە خوەی نیەکیٚگ .
**ئه‌جـاو** [تم] ئه‌جـاب : هەی بانـووی بیٚ عەیب پەردەی ئه‌جاو هەی ـ هەی مەنیجەی دوخت ئەفراسیاوە هەی [فولکلور] .
**ئه‌جاو دار** [ئن] ذو حیاء ، ذو شرف وکرامة
**ئه‌جاو کردن** [ئن] الاستحیاء : لە خودا ئه‌جاو بکە .
**ئه‌جەڵ** [ن] ۱ ـ اجل ۲ ـ موت
**ئه‌جەو** [ن] قیمة ، اعتبار : ئه‌جەو کەس نیەزانی وه هیچ

**ئەچم** [ئن] مشوه.
**ئەچم کردن** [چ] التشويه: ئاوڵله، ئەجم دەم وچەوی کردگه.
**ئەخش** [ن] ١ ـ سبيل: له ئەخش خودا ٢ ـ عشق: ئەخش دڵوەر ئەڵگرتگەسەی.
**ئەڕا ١** [پپ] الى: بچوو ئەڕا ماڵ.
**ئەڕا ٢** [ئپ] لماذا: ئەڕا نەهات؟
**ئەڕاو** [سر] لهذا السبب: ئەڕا نەهات؟ ئەڕاو!
**ئەرەج** [ن] ١ ـ فلك ٢ ـ علياء ٣ ـ غاية، قصد: قسەی بێ ئەرەج.
**ئەرەق** [ن] ١ ـ عرق ٢ ـ مشروب العرق، الخمر
**ئەرەقچين** [ن] طاقية
**ئەرەق کردن** [چ] التعرق، ان يتصبب العرق
**ئەرەقين** [ئن] مبلل بالعرق
**ئەرباب** [ن] ١ ـ اصدقاء، معارف ٢ ـ اشراف الناس
**ئەرجن** [ن] شجرة تنمو في المناطق الجبلية (ارجون ـ عامية عراقية)
**ئەرجنەك** [ن] ١ ـ جنيه ٢ ـ [م] شكل مخيف
**ئەرخەوان** [ن] شجرة الارجوان
**ئەرك** [ن] ١ ـ وظيفة، وظائف ٢ ـ مصاريف ٣ ـ مسؤولية
**ئەرمان** [ئن] رحيم رؤوف: يا ئەڵڵا ئەرمان له جيه نەرمان [فولكلور]

**ئەرواو** [ن] مزارع
**ئەرواوی** [ن] زراعه، فلاحه
**ئەرواویکەر** [ن] مزارع، فلاح.

**ئەرواوی کردن** [چ] ممارسة مهنة الزراعة: کاری هەر ئەرواوی‌کردنه.
**ئەرێ** [سـر] لجلب الانتباه: ئەرێ خوونەهاتەو! ٢ ـ للبدء بالکلام والاستفسار: ئەرێ کی دەسمێەتم دێگ!
**ئەزەڵ** [ن] ازل: الیوم الاول من بدء الخلق
**ئەزەڵی** [ئن] أزلی، سرمدي
**ئەزبیه** [ن] ١ ـ بیوت الشعر ٢ ـ الرعاة الرحل
**ئەزرەقوون** [ن] زریقون، مسحوق یعقم به جسم الطفل
**ئەزیز** [ن] ١ ـ عزیز ٢ ـ جمیل ٣ ـ طیب
**ئەزیزی** [ن] ١ عزة ٢ ـ جمال ٣ ـ طیبة
**ئەژدەها** [ن] سنان، افعی سامة
**ئەژنەفتن** [چ] السمع
**ئەژنوو** [ن] رکبة
**ئەسپ** [ن] حصان
**ئەسپاو** [ن] معدات، آلات
**ئەسپەن** [ن] نبات الحرمل، حبة الحرمل
**ئەسپڵ** [ن] طحّال
**ئەسحابە** [ن] اصحاب الرسول (ص)

**ئەسر** [ن] دمع : چەوی، پڕەو بوَ لە ئەسر
**ئەسرکردن** [چ] التدمع : چەوم ئەسر کێگ .
**ئەسرین** [ن] ١ ـ دمعی ٢ ـ مخضب بالدمع
**ئەسقەملی** [ن] ورق من اوراق اللعب
**ئەسکەر** [ن] عسکری، جندي
**ئەسکەری ١** [ن] عسکریة، جندیة
**ئەسکەری ٢** [ئن] عسکري، خاص بالعسکریة .
**ئەسکەری کردن** [چ] اداء الخدمة العسکریة
**ئەسکو مەدەر** [در] التوکل، الاتکال: یا عەلی ئەسکو مەدەر
**ئەسڵ** [ن] ١ ـ اصل ٢ ـ فصیلة ٣ ـ منبع
**ئەسڵمەن** [ن] اصیل : ژنی ئەسڵمەن .
**ئەسیر و ئەبیر** [در] عن بکرة . . ئەسیر و ئەبیریان دەر بکەن
**ئەغماز** [ن] ١ ـ حیاء ٢ ـ ادب
**ئەغماز دار** [ئن] ١ ـ ذو حیاء ٢ ـ مؤدب
**ئەغماز کردن** [چ] الاستحیاء، الشعور بالخجل
**ئەشك** [ن] عطر، روائح طیبة
**ئەشکەفت** [ن] کهف
**ئەشکەنجە** [ن] تعذیب
**ئەشکەنجەدان** [چ] التعذیب
**ئەشم** [ئن] اشهب، شهباء
**ئەشم بوونەوە** [چ] ان یشهب، ان تشهب

**ئەشم کردنەوە** [چ] جعله يصبح أشهب، شهباء
**ئەشمی** [ن] كون الحيوان اشهب اللون
**ئەغد** [ن] ١ ـ قدر، ٢ ـ قياس
**ئەغدگرتن** [چ] ١ ـ التقدير ٢ ـ القياس: ئەغدی بگر، بزان چەنیّ بەس کێگ.
**ئەغماز** [ن] ١ ـ حياء ٢ ـ ادب
**ئەغمازدار** [ئن] ١ ـ ذو حياء ٢ ـ مؤدب
**ئەغمازکردن** [چ] الاستحياء، الشعور بالخجل: فرە زمختە ئەغماز لە کەس نیەکێگ.
**ئەفاقە** [ن] ١ ـ علاج: دەردی بگری، نە لەلای مەلا و نەیش لە لای دەوریش ئەفاقەی نەوگ ٢ ـ رحم: خودا ئەفاقە ئەراد بکێگ
**ئەفاقە کردن** [چ] ١ ـ العلاج ٢ ـ ان يرحم
**ئەفرار** [ئن] منزعج، متضايق
**ئەفرار بوون** [چ] الانزعاج، الشعور بالضيق
**ئەفرار کردن** [چ] الازعاج، المضايقة: چل وقلە ئەفرارمان کردگە لە گیان.
**ئەفراری** [ن] انزعاج، مضايقة، ضيق
**ئەفراز** [ن] ١ ـ خلاص ٢ ـ عتق
**ئەفراز بوون** [چ] ١ ـ التخلص ٢ ـ الانعتاق
**ئەفراز کردن** [چ] ١ ـ التخليص ٢ ـ العتق
**ئەفسانە** [ن] ١ ـ اسطورة ٢ ـ حكاية خرافية ٣ ـ ملحمة

**ئەفسانەیی** [ن] ١ ـ اسطوري ٢ ـ خرافي ٣ ـ ملحمي
**ئەفسوس** [ن] أسف، حسرة
**ئەفسوس خواردن** [چ] التأسف، التحسر
**ئەفسوون** [ن] ١ ـ سحر ٢ ـ شعوذة
**ئەفلیج** [ئن] المصاب بالفالوج
**ئەفلیجی** [ن] حالة الاصابة بالفالوج
**ئەقرەو** [ن] عقرب: ئەقرەو دا وە دەسیەوە.
**ئەقرەوین** [ئن] كثير العقارب
**ئەقڵ** [ن] ١ ـ عقل: چەنی بێ عەقڵە! ٢ ـ حكمة: وە عەقل كار بكە
**ئەقڵاو** [ن] كميه من الزرع المحصود تدرس قبل جمع الحاصل وتذرى وتطحن
**ئەقڵەوكردن** [چ] ١ ـ التعقل ٢ ـ اعادة النظر في امر ما: ڕووڵە كەمێ ئەقڵەو بكە.
**ئەقڵ كَرتن** [چ] التعقل، ان يزداد تعقلا وحكمة
**ئەكسیر** [ن] ١ ـ حجر الفلاسفة ٢ ـ مادة يزعم انها تخلد الحياة
**ئەكلەمە** [ئن] ١ ـ سهل الكسر ٢ ـ خفيف ٣ ـ غير متلاصق، غير مشدود جيدا ٤ ـ مهزوز: دیوارەگە ئەكلەمەسە.
**ئەكلەمەیی** [ن] ١ ـ سهولة الكسر ٢ ـ خفة ٣ ـ تراضی
**ئەگ** [سر] تستعمل للاستغراب والتحذير: ئەگ لێ مارە!

**ئەگە** [سر] تستعمل للاستهجان: ئەگە لێ کورە!
**ئەگـەر** [أ] **شرطيـة**، إذا، فيمـا إذا، لو: ئەگەر کار بکەی دەوڵەمەن بۆد
**ئەگەر مەگەر** [ئن] **مجهول**، غير مؤكد: هاتنیان ئەگەر مەگەرە
**ئەل** [ن] **غسل**، تنظيف، **تطهير**: ئەلی دەوریەگە بکە
**ئەڵاتن** [چ] ١ ـ **الشـروق** ٢ ـ **الاختمـار**، التخمـر ٣ ـ التفقس ٤ ـ ارتفاع **الصوت**: هەم دەنگی ئەڵات!
أ ـ لێ ئەڵاتن [چ] ان **ينبری** له: دەنگ مەکە داڵگی لیت ئەڵای
**ئەڵاج** [ن] ١ ـ علاج ٢ ـ حل
**ئەڵاجەوَ** [ئن] ١ ـ عجيب ٢ ـ غير مألوف
**ئەڵاج کردن** [چ] ١ ـ المعالجة ٢ ـ وضع الحل
**ئەڵاژانن** [چ] ١ ـ التمـديـد على الارض اوعلى الفراش ٢ ـ السجى
**ئەڵاژیان** [چ] التمدد على الارض او الفراش
**ئەڵامەت** [ن] ١ ـ عجب ٢ ـ غرابه
**ئەڵامەتی** [ئن] ١ ـ عجيب ٢ ـ غريب
**ئەلاوەیسی** [ن] نوع من المقام الكردي
**ئەڵاوردگا** [ن] مفقس
**ئەڵاوردن** [چ] ١ ـ التقيؤ ٢ ـ تفصيل الملابس ٣ ـ قص الشعر عزاءً ٤ ـ التفقيس ٥ ـ القراءة، عملية القراءة ٦ ـ

فك الـرمـوز ٦ ـ الاكتشـاف : کەس ناتـوانیٚ عەیبی لیٚ
ئەلاٚلی ٧ ـ رفع الصوت : کەمیٚ دەنگت ئەلاٚل
**ئەلئەمان** [سر] صرخة الاستغاثة
**ئەڵە** [ن] نوم [طفل]
**ئەڵەك** [ن] منخل
**ئەڵەکردن** [چ] ان ينام
**ئەڵـەك كردن** [چ] التنخيل : التنظيف بالمنخل : ئەڵەکی ئاردەگە بکە .
ـ لە ئەڵەك دان [چ] التنخيل ، التنظيف بالمنخل
**ئەڵبەت** [سر] طبعا! بالطبع! : ئەڵبەت، کابرا خوەی رازیە!
**ئەڵبەتە** [تم] ئەڵبەت

**ئەڵبووقیان** [چ] الصرخة ، الانتفاض في وجه : هەرکەس دەم بچەکنیٚ ئەڵبووقیٚ وە رَویا.
**ئەڵپاچین** [چ] ١ ـ قص [الشعر] بدون انتظام ٢ ـ البري
**ئەڵپەرگە** [ن] رقصة الدبكة ، رقصة
**ئەڵپەڕگەکەر** [ن] راقص الدبكة
**ئەڵپەڕگەکردن** [چ] الدبكة
**ئەڵپەڕوداپەڕ** [ن] التراقص فرحا
**ئەڵپەڕین** [چ] القفز والضرب على الارض تعبيرا عن الرفض

ـ لێ ئەڵپەرین [چ] الانبراء: هەرکەس قسە بکێگ لێ ئەڵپەڕێ

**ئەڵپڕوکیان** [چ] الارتباك: ئەڵپڕوگیاو دەمی قسە نەگرت.

**ئەڵپشانن** [چ] النثر او التلویث برشاش الماء او اي سائل اخر: ئەوە چە کردید، ئاوەگە لیمان ئەڵپشانی!

**ئەڵپشیان** [چ] التناثر على شكل قطرات

**ئەڵپلانن** [چ] الارجاع: هەر دیەمان ئەڵپلانەو وەرەو خوار.

**ئەڵپلیان** [چ] الرجوع، الاستدارة

**ئەڵپیچانن** [چ] ان ینبري له: لە وەرەو ئەڵپێچایەم.

**ئەڵتەرەقانن** [چ] التفتیت (ابقار): گامرگ، ئەڵترەقنێگەد!

**ئەڵتەرەقیان** [چ] التفتت [بسبب الاصابة بالمرض].

**ئەڵتەکانن** [چ] ١ ـ التدمیر، التحطیم ٢ ـ التلویح بالید ٣ ـ لف ورفع الفراش من الارض ٤ ـ تنظیف (الحبوب من العوالق) بتحریکها ورمیها الى الارض

**ئەڵتەکیاگ** [ئن] مدمر، محطم ٢ ـ ملفوف ومرفوع ٣ ـ منظف (اعادة السابقة)

**ئەڵترازیاگ** [ئن] ١ ـ المقلوع من محله ٢ ـ مرتد

**ئەڵترازیان** [چ] ١ ـ خروج الشيء من محله ٢ ـ الارتداد ٣ ـ التطایر

**ئەڵتیزگانن** [چ] العنفصة: قاترەگە خاسە، وەلێ

ئه‌ڵتیزگنێ

**ئه‌ڵجریان** [چ] الالتواء : گه‌ڵی ئه‌ڵجریا

**ئه‌ڵچپانن** [چ] ١ ـ فتق الخياطة ٢ ـ فتق النسيج

**ئه‌ڵچپیاگ** [ئن] مفتوق

**ئه‌ڵچپیان** [چ] الانعتاق

**ئه‌ڵچوون** [چ] الارتفاع : چوَ ده‌ست لێ ئه‌ڵچوو؟

**ئه‌ڵچنین** [چ] ١ ـ الالتقاط ٢ ـ التجميع بالالتقاط ٣ ـ البناء : دیواری باخه‌گه ئه‌ڵچن .

**ئه‌ڵخسن** [چ] ١ ـ نشر (الغسيل) ٢ ـ تركيب (الالة) ٣ ـ جعل (صغار الحيوان) يرضع : ساواگان ئه‌ڵخه

**ئه‌ڵدان** [چ] ١ ـ اللم : هام ئه‌ڵدان ٢ ـ النصب : ماڵ ئه‌ڵدان

**ئه‌ڵدرومانن** [چ] الحفر بدون انتظام : زه‌وَ ئه‌ڵدرومانن

**ئه‌ڵدرومیاگ** [چ] محفور بدون انتظام

**ئه‌ڵدرین** [چ] ١ ـ البقر : سه‌گ زگی ئه‌ڵدری ٢ ـ الحفر بدون انتظام

**ئه‌ڵرواکانن** [چ] التلقف : کتابه له ده‌سێ ئه‌ڵرواکان

**ئه‌ڵسانن** [چ] ١ ـ الايقاظ ٢ ـ الانهاض : گرت له ده‌سێ و ئه‌ڵسانه‌ی . ٣ ـ جعله ينلعث، يتصاعد : دوَدی له ماڵیان ئه‌ڵسان .

**ئه‌ڵسپاردن** [چ] الرص : سه‌وزگوونیه گه‌نم ئه‌ڵسپاردگه .

**ئه‌ڵسیاگ** [ئن] ١ ـ مستيقظ ٢ ـ قائم .

**ئەڵسیان** [چ] ١ ـ الاستیقاظ ٢ ـ القیام ٣ ـ الانتهاء: کەی دەوام ئەڵسێ؟ ٤ ـ الاضطلاع بـ: کی بوێری ئەڵسی وەی کارە ٥ ـ الانبعاث، التصاعد: تووز لە شوونەگەیان ئەڵسیا.

**ئەڵشکانن** [چ] الافلاس: جعله یفلس: جەنگ فرە کەسە لێ ئەڵشکان.

**ئەڵشکیاگ** [ئن] مفلس.

ئەڵشکیان [چ] ان یصبح مفلسا: پارەکە ئەڵشکیا وەڵێ مسال دەونەمەنە.

ئەڵشیوانن [چ] المغثة: خواردنەگە دڵێ ئەڵشێوان

ئەڵشیویان [چ] ١ ـ الانغثاث: لە چشتەگە دڵم ئەڵشێوێ ١ ـ الاختلاف: لە یەك ئەڵشێویان

**ئەلف وبێ** [ن] الالف باء: ئەلف وبێی کوردی جوور ئەلف و بێی عەرەبی یە.

**ئەڵقەپانن** [چ] الاختطاف: کتابەگە لە دەسم ئەڵقەپان و وای.

**ئەڵقرچانن** [چ] الاحراق کما في وضع الملح على الجرح: ترشی و سووری زەخم ئەڵقرچنێ.

**ئەڵقرچیان** [چ] الاحتراق، المادة السابقة

**ئەڵقورانن** [چ] الاجتراع، الشفط: یەك دەوری یەخنی ئەڵقوران.

**ئەڵکەفتگ** [ئن] ١ ـ عملاق ٢ ـ ضخم

**ئەڵکەفتن** [چ] ١ ـ ترکب، انقعاد (الاله) ٢ ـ ان یرضع صغار الاغنام من امهاتها ٣ ـ ان یصبح عملاقا ٤ ـ ان یصبح ضخما

**ئەڵکرانن** [چ] ١ الحفر او الازالة: ئەناوی دیوارەگە ئەڵکرن ٢ ـ التخدیش: وە چنگیر دەم وچەوی ئەڵکرن ٣ ـ البروز: ئەحمەد ئەڵکرانگە لە براگانی ٤ ـ التکشیط.

**ئەل کردن** [چ] التنطیف رمزیا: ئەلی قاپەگە بکە

**ئەڵکردن** [چ] ١ ـ لف الشيء حول... : بەن ئەڵکردن ٢ ـ هبوب (الریح): وا ئەڵکرد ٣ ـ تحمل العیش مع: چۆن لە لای ئەڵکەی!

**ئەڵکزانن** [چ] التسفیع، التلفیح

**ئەڵکزیان** [چ] التسفع، التلفح

**ئەڵکفانن** [چ] الاحراق بالمواد الحارة (کالفلفل).

**ئەڵکلاشین** [چ] ١ ـ التکشیط ٢ ـ الازالة (بآله) ٣ ـ الازالة بالتکشیط ٤ ـ القلع، السمل ٦ ـ التظفیر.

**ئەڵکیشان** [چ] ١ ـ الرفع الی الأعلیٰ سحباً ٢ ـ لبس [احذیة، کلشان] برفع المؤخره الی الأعلیٰ ٣ ـ املاء الشيء بصورة تامە: کونەی ئەڵکیشا لەئاو ٤ ـ الاخراج: چمان دڵم ئەڵکیشی.

**ئەڵکیشیاگ** [ئن] ١ ـ مملوء: مەشکەی ئەڵکیشیاگ لەدوو ٢ ـ ممتلیء غضباً: لەخوسە ئەڵکیشیاگ لا

**ئەلکیشیان** [چ] الامتلاء غضباً ٢ ـ الملیء

**ئەڵگەردیان** [چ] التعقف: دەمی تیشگەگە ئەڵگەردیا.

**ئەڵگـرتن** [چ] ١ ـ الحمـل: ئەو بوخچـە ئەڵگـرد ٢ ـ الآختطاف: بەرزوو دوەتێ ئەڵگرت ٣ ـ التحمل: کی نازی ئەڵگرێ؟

٤ ـ التقبل: چوَن خودا لەباتی چەوی ئەڵگرێ: ٥ ـ تحمـــل (الخســـارة) من بەشـەگـەی ئەو ئەڵگـرم ٦ ـ الـرفـع: تووزێ دەست ئەڵگـر ٧ ـ التخزین: ئازووقە ئەرا زمسان ئەڵگرت

٨ ـ الأقتفاء: شوونی پای ئەڵگرتن تا وە ماڵ ٩ ـ فتح (الباب): وە بسمارێ قاپیەگە ئەڵگرت ١٠ ـ الأدخار: مانگێ نزیکەی سەت دینار ئەڵگرێ

**ئەڵگیـریـاك** [ئن] ١ ـ مخطـوف ٢ ـ محفـوظ ٣ ـ مخزون ٤ ـ مفتوح

**ئەڵماس** [ن] معدن الماس

**ئەڵمالین** [چ] ١ ـ أن یشمر: کەمێ باڵت ئەڵماڵ، تا تیماری زەخمەگە بکەم ٢ ـ التهیؤ: ئەرا چە باڵ ئەڵمالیدە!

**ئەڵنان** [چ] وضع [الطعام، الماء] علیٰ النار: ئاوی چای ئەلناگە.

**ئەڵهێ** [ن] لحد

**ئەڵهێزانن** [چ] أثارة [الجرح] پیاز زەخم ئەڵهێزنێ
**ئەڵهێزایان** [چ] ثوران [الجرج]: دمەڵەگەی پیشتی ئەڵهێزیاگە.

**ئەلوا** [سر] لیت، حبذا: ئەلوا ئەولدا بهاتام!
**ئەڵوارگانن** [چ] جعله یفز (من النوم): کوڕە لە خەو ئەڵوارگان
**ئەڵوارگیان** [چ] التفزز (من النوم): کوڕە لە خەو ئەڵوارگیا

**ئەڵواسان** [چ] التعلیق: ئەڵواسەی وە دیوارەگەیا
**ئەڵواسیاگ** [ئن] معلق: وینەی ئەڵواسیاگ.
**ئەڵواقانن** [چ] ١ ـ الأختطاف ٢ ـ التلقف
**ئەڵوەخت** [ن] ١ ـ غلق ٢ ـ اسکان: دەم ئەڵوەخت دان

**ئەڵوەخت دان** [چ] ١ ـ الأغلاق ٢ ـ الأسکات
**ئەڵوەسین** [چ] ١ ـ التنظیم ٢ ـ الأختلاق: ئەڕا قسە لە پای مەردم ئەڵوەسین؟
**ئەڵوەشانن** [چ] الرمی الی الأعلی: ئەڵوەشنەی لە هەوا.
**ئەڵورانن** [چ] ١ ـ التزییر: لەپگی چاکەتەگەی ئەڵوران ٢ ـ أن یشبك: دەس ئەڵوران
**ئەڵوڕگیاگ** [ئن] مختمر، [عجین]

**ئەلورگیان** [چ] التخمر ١ ـ عمل (شنكه) ٢ ـ الأبادة: يەك ئەڵورين

**ئەڵوژانن** [چ] ١ ـ الأختبار: من بەختيار ئەڵوژانم ٢ ـ الأنتقاء: وه دڵی خوەئ يەكی ئەڵوژن. ٣ ـ التنظيف بأنتقاء المواد من: گاڵەی ناو گەنمەگە ئەڵوژنن

**ئەڵوفانن** [چ] جعله بلتهب [مرض] تەو ليۆ ئەڵوفنێ

**ئەڵوفيان** [چ] الألتهاب: هەر تەوم بگری لێوم ئەڵوفێ

**ئەڵوَ** [تم] ثالو بالو

**ئەڵوَچانن** [چ] العصر باليد

**ئەڵونجانن** [چ] ١ ـ صب [الطعام] ٢ ـ أملاء [القرب] بالماء: كونەيەگ ئەڵونجان لە ئاو

**ئەم** [ن] اكل، طعام [طفل]

**ئەمار** [ن] ١ ـ عمبار ٢ ـ المزى: مخزن الغلال و الحبوب

**ئەمەڵ ١** [ئن] ١ ـ مُقَلدْ ٢ ـ غير متقن: كارێ ئەمەڵ

**ئەمەڵ ٢** [ن] ١ ـ عاده: ئەمەڵی بەد مەكە ٢ ـ طبع: فره ئەمەڵی بەده

**ئەمەڵی** [ن] حالة كون الشيء مقلداً ٢ ـ عدم الأتفاق

**ئەمبەر** [ن] عنبر

**ئەمبەری** [ئن] عنبري، لون عنبری

**ئەمدای** [ن] مدد، نجده: كەس نەهات لە ئەمدایی

**ئەمدابکەر** [ن] مُنجد: کی ئەمداربکەریە؟
**ئەمر** [ن] ۱ ـ أمر ۲ ـ طلب
**ئەمرکردن** [چ] ۱ ـ أن یأمر ۲ ـ أن یطلب
**ئەمری خودا** [ك] وفاة.
ئەمری خودا کردن [چ] الوفاة: ساروو ئەمری خودا کرد.
**ئەمزووك** [ن] مبسم: جغارەکیشان بیٚ ئەمزووك خاس نیٚیە
**ئەمشیٚر** [ن] تعهد، استعداد
**ئەمشیر کردن** [چ] التعهد، الأستعداد: کی ئەمشیٚر کرد؟
**ئەم کردن** [چ] الأکل، التغذي [طفل]
**ئەمڵە** [ن] الرُّحل
**ئەمناك** [ئن] ۱ ـ أمین، آمن ۲ ـ هادیء
**ئەمنەوبوون** [چ] ۱ ـ التزام الهدوء: کەمە کەمە ئەمنەو بوَین ۲ ـ العودة الی الهدود: دنیا ئەمنەو بوّە.
**ئەمنەوکردن** [چ] التهدئە: کەم دەسی ئەمنیٚەو کردگە.
**ئەمین** [ئن] أمین، أمن
**ئەنار** [ن] رمان، شجرة الرمان
**ئەناراو** [ن] قیح، صدید
**ئەنارین** [ئن] کثیرة الرمان [منطقة]

**ئەنازە** [ن] ١ ـ حد ٢ ـ مثيل ٣ ـ قياس ٤ ـ هندسه
**ئەنام** [ن] عضو [الجسم]: ئەنامەی گیانم لە یەك چەکیاگە.
**ئەناو** [ن] لبخ [الحيطان] ٢ ـ رشق [السطوح]
**ئەناو دان** [چ] ١ ـ اللبخ ٢ ـ الترشيق
**ئەناودەر** [ن] الذي يلبخ، يرشق
**ئەنایشتە** [ن] طعام الفطور: ئەنایشتەی شەوەکیان سیّ نانە
**ئەنایشتەکردن** [چ] تناول طعام الفطور
**ئەنەخورد** [ن] مرتع، مرعی خصب
**ئەنجاخ** [ئك] بالكاد: ئەنجاخ ئێوارە کار وە ئەنجام برەسنم. ئەنجاخ سوو بانەوە.
**ئەنجام** [ن] ١ ـ نتيجة: ئەنجامی نێکی هەر نێکی یە ٢ ـ حاصل، ناتج [...]
**ئەنجامە** [ن] حجامە
**ئەنجامەگرتن** [چ] أخذ الحجامة: ساڵیّ جاریّ ئەنجامەی سەرم گرم.
**ئەنجام دان** [چ] التحقيق: ئەنجامی کار دان
**ئەنجامدەر** [ن] الذي يحقق الأعمال
**ئەنجگ ئەنجگ** [ئن] مقطع مجزأ: لەشیّ ئەنجگ ئەنجگە

**ئەنجــگ ئەنجــگ کردن** [چ] التقطيــع الى أجــزاء صغيرة: ئەنجگ ئەنجگی لەشی کرد.
**ئەنجن ئەنجن** [تم] **ئەنجگ ئەنجگ**
**ئەنجن ئەنجن کردن** [تم] **ئەنجگ ئەنجگ کردن**
**ئەنجومەن** [ن] ١ ـ مجلس ٢ ـ هيئه
**ئەنجير** [ن] تين، شجرة التين
**ئەندەك** [ن] قليل جداً، ئەندەکی ما بۆ لێ بدێ،
**ئەنديشه** [ن] ١ ـ خيال ٢ ـ الهام
**ئەنديشەيی** [ئن] ١ ـ خيالی ٢ ـ الهامی
**ئەنزەرووت** [ن] ١ ـ عنزروت ٢ ـ شيء نادر وثمين
**ئەنگار** [ن] فرضيه، أعتقاد
**ئەنگــار کردن** [چ] الأفتــراض، الأعتقــاد: ئەوقــەره خوسەی ليم تيێ، ئەنگار کەێ باوگی کوشتمه.
**ئەنگەر** [ن] ١ ـ مرسى السفن ٢ ـ علامة من لعبة «لگاو».
**ئەنگــەرکــوتــان** [چ] ١ ـ الـرســو ٢ ـ الأستحکــام في موضوع أو مکان: دژمن هەر برەسێگه ئەو بەرزاییيه ئەنگەر کوتێ.
**ئەنگەز** [ن] احراش، منطقه أحراش
**ئەنگوور** [ن] عنب.
**ئەنگووراو** [ن] قيح ، صديد

**ئەنوَ** [سر] ماذا أذا: ئەگەر کار نیەکەید، ئەنوَ چەکەید!
**ئەنوا** [ن] ثروة، مال
**ئەنوابڕ** [ئن] معدوم. محروم
**ئەنوابڕ بوون** [چ] أن يصبح معدماً
**ئەنوابڕ کردن** [چ] الأفقار، جعله يصبح معدماً
**ئەنوابڕی** [ن] فقر، املاق
**ئەنوو** [ن] عبرات.
**ئەنووز** [ن] غفوه، سنەمن النوم
**ئەنووز کردن** [چ] الأغفاء، أن تأخذْ سنه من النوم: ئەو سێ رووژە ئەنووز نەکردمە.
**ئەنوو گرتن** [چ] أن تأخذْ العبرات: هەر دیەمان ئەنوو گرتەی.
**ئەنیش** [ن] أهتمام، أعتيار.
أ ـ ئەنیش وەخاتراهاتن [چ] أعارته أهمية: کوڕەی لە وەر دەمی کوشیاو ئەنیش وە خاتری‌دا نەهات.
**ئەو** [ئن] ١ ـ ذاك، ذلك، تلك ٢ ـ الذي، التي
**ئەوَ** [ر] هو، هي: ئەوَ لە براگەی گەواترە.
**ئەوان** [ر] هم، هنّ: ئەوان ناسیاگن.
**ئەوانە** [ر] أولئك: ئەوانە برامن
**ئەوج** [ن] قمة، ذرى
**ئەوجار** [ن] من قطع المحراث الخشبي

**ئەور** [ن] غیم، سحاب: جوور ئەوری وەهار بگرمن و نەوار (پەند)
**ئەورە** [ئك] هناك، هنالك: ئەورە لە گەرمەسێر گەرمترە.
**ئەورهاوردن** [چ] التلبد بالغیوم
**ئەورێشم** [ن] حریر: مشكی ئەوریشم
**ئەورێشمین** [ئن] حریری
**ئەوز** [ن] عوز، نقص: بێ ئەوزە.
**ئەوزار** [ن] أدوات، آلآت، معدات
**ئەوزەڵ** [ن] ١ ـ أرتیاح ٢ ـ راحة ٣ ـ تنفیس
**ئەوزەڵ كردن** [چ] ١ ـ الترویح ٢ ـ أن یأخذ الراحة ٣ ـ التنفیس
**ئەوسا** [ئك] حینئذٍ، في ذلك الوقت
**ئەوسار** [ن] مقود، رشمة
**ئەوسار كردن** [چ] وضع المقود في رأس الحوان: ئەوساری ئەسپەگە كرد.
**ئەول** [پپ] مع: ئەولی كیدا هاتی؟
**ئەوڵە** [ئن] ١ ـ منافق ٢ ـ أبلە
**ئەو مەڕەس** [ئن] الذي، التي لا یتفاهم: كابرایەگی ئەو مەڕەسە
**ئەهـ** [س] للتعبیر عن التألم والحسرة والدهشە: ئەهـ

برابوو! .

**ئەها** [تم] ئاها

**ئەهەك** [ن] ١ ـ جير، كلس، صاروج ٢ ـ سحق ٣ ـ أنسحاق

أ ـ وه ئەهەك بوون [چ] الأنسحاق التام: پیاڵەگە، بوَه وه ئەهەك.

ب ـ وه ئەهەك كردن [چ] السحق التام

**ئەهــرام** [ن] ١ ـ أحـرام، غطـاء خفيف مصنـوع من الصـوف ٢ ـ غطـاء يلبسـه الحجـاج عند أداء فريضة الحج. ويكون عادة أبيض اللون.

**ئەهوەن** [ئن] أخف، أهدأ، أهون

**ئەهوەنەوبوون** [چ] أن يصبح خفيفاً، هادىء، هيناً، سهلاً: ژانی سەرم کەمێ ئەهوەنەو بوَ. .

**ئەهوەنەو کردن** [چ] جعله يخف، يهدأ.

**ئەهونی** [ن] حالة كون الشيء خفيفاً، هادئاً

**ئەی ١** [ئب] يا، ايها: ئەی مەردم

**ئەی ٢** [سر] للتعبير عن الأستغراب وللأستفسار

ئەگەر نە نەچی، ئەی کی بچوو!

**ئەیانە** [أ] ١ ـ شرطی، إذا: ئەیانە هاتن ٢ ـ للتنبيه، إذا ما

**ئەیانە** [ر] هؤلاء: ئەیانە هاوسامانن

ئەیە [ر] هذا، هذە: ئەیە لە ئەوە خاسترە.
**ئەیلوول** [ن] ایلول: الشهر التاسع من السنة الميلادية
**ئبلیس** [ن] أبليس
**ئتبـــار** [ن] قيمــة، أعتبـار: چەنێ سەین بوَد، چەنی ئتبارد لە لای مەردم فرە بوو.
**ئتباردار** [ئن] ذو قيمة، معتبر
**ئتـــر** [ن] ١ سيـارة،مختصـر كلمـة (ئـوتـرومبيـل) ٢ ـ أستراحة: لە شەوەکیەو تا ئێرنگە ئتر نەکردمە.
**ئتقاد** [ن] ١ ـ أعتقاد ٢ ـ أيمان
**ئتقاد کردن** [چ] ١ ـ الأعتقاد ٢ ـ الأيمان
**ئتلا** [ن] علم، اطلاع: خودا ئتلا دێرێ
**ئجرا** [ن] ١ ـ تحقيق ٢ ـ تنفيذ
**ئجرا** کردن [چ] ١ ـ التحقيق، الانجاز ٢ ـ التنفيذ
**ئرج** [چ] جذر: لە ئرجا دەری کرد.
**ئرمس** [ن] ١ ـ قطرذاذ، ٢ ـ قطرة: ئرمس لە چەوی نەهات
**ئروە** [ن] مستمسك
**ئزرەو** [ن] مرض السل
**ئزرەودار** [ئن] مسلول
**ئزر برین** [چ] أزالـة الأعـذار: دە دینـاریتر بدە پێیو

**ئزردار** [ئن] معذور

**ئزمەت** [ن] ١ ـ قدر، أحترام ٢ ـ مداراة

**ئزمـــەت گرتـن** [چ] ١ ـ الـتقــديــر، الأحتــرام ٢ ـ المداراة: ئەو شەوه فره ئزمەتمان گرت!

**ئسپار** [ن] عزج: قلب التربة بالمسحاة.

**ئسپاركەر** [ن] الذي يقلب التربة بالمسحاة

**ئسپار كردن** [چ] الغزج

**ئستا** [ن] ١ ـ أستاذ ٢ ـ خبير

**ئسرافيل** [ن] مَلكْ أسرافيل.

**ئسســـه** [ســـر] إذن! مادام الأمـر كذلـك: ئسســه من نيەتيم، ئەگەر وەپاچين.

**ئسفەنج** [ن] أسفنج، حيوان الأسفنج

**ئسكەناز** [ن] العملة الأيرانية

**ئسكنگ** [ن] مسحاة صغيرة

**ئسلام** [ن] أسلام

**ئسلامى** [ئن] اسلامى، خاص بالأسلام

**ئشپش** [ن] سوسة الطحين

**ئشپش دان** [چ] التسوس: ئاردەگە ئشپش داگە.

**ئشر** [ن] لە ئشرنان: الأنفاق علىٰ. تأتي هذه الكلمة بمعنىٰ الخسارة: وە يەك مانگ هەزار دينار لە ئشرى نام.

**ئشکڵ** [ن] أشكال

**ئشکنه** [ن] المثروده: أكله تعد من الخبز اليابس والدهن

**ئفت** [تم] ئشر

**ئفتەسڵ** [ن] مشتكىٰ

**ئفتەسڵ کردن** [چ] أن يشكيه الى: ئفتەسلى بکە وە خودا.

**ئقیر** [ن] منكر، ملك منكر: ئقیرو نەقیر: منكر ونكير.

**ئم** [سر] للتعبير عن الغضب: ئمه سەرد.

**ئمجا ۱** [پو] ۱ ـ ثم: ئەو هات و ئمجا خوەیشکەگەی ۲ ـ نان بخوەن ئمجا میوه.

**ئمجا ۲** [سر] إذن ماذا: خوو براگەت نەهات. ئمجا!

**ئمڕو** [ئك] ۱ ـ اليوم ۲ ـ في الوقت الحاضر

**ئمساڵ** [ئك] هذه السنة، هذا العام: پارەکە مرد تا ئمساڵ.

**ئمشەو** [ئك] **هذه** الليلة، **وتفهم على** انه الليلة الماضية

**ئنز** [ن] ۱ ـ حد: له ئنزى خوەد بووس ۲ ـ سن:

**ئنزگرتن** [چ] الوصول الى الحد المطلوب: نرخى خانگەگە ئنز گرتگە

**ئوخ** [سر] للاستغراب: ئوخ! نەهات!

**ئوخر** [تم] ئاخر ئوخر

**ئوورتە** [ن] نوع من السجاد

**ئوی** [سر] للحسرة: أ ـ سەردار مرد ـ ئوی! کەی؟

**ئومێد** [ن] ١ ـ أمل ٢ ـ أمنیە

**ئومێدەوار** [ئن] ١ ـ متأمل ٢ ـ متمن

**ئووخەی** [سر] للفرحة والرضا والأستحسان: ئووخەی، لەی دەردەسەریە قوورتارم بوَ! ئووخەی لەی کوڕە!

**ئووخەیش** [تم] ئووخەی

**ئووخەی کردن** [چ] التنعم بالسعادة والفرح: لەی عومرێ دریژە ئووخەی نەکردمە

**ئوورە** [تم] ئەورە

**ئووردگا** [ن] ١ ـ معسکر ٢ ـ ثکنات الجیش

**ئوردی** [ن] جیش

**ئوغر** [سر] خیراً، الی أین: من بچم ـ ئووغر ـ ئەڕا کار.

**ئووغرە** [ن] شماتە

**ئووغرەدان** [چ] التشمت

**ئووغر کردن** [چ] السفر

**ئووی** [سر] للأستغراب والأستنکار: ئووی ئەو چە کردید!

ئووینه [ن] مستمسك، عروه، داع، موجب
ئێ [ر] هذا، هذه: ئێ کاره، وه ته شووره.
ئێدی [سر] بعد، ماذا اذن
ئێره [تك] هنا: ئێره له شار خاستره
ئێـــرنگـه [ئـك] الآن، في هذا الـوقت: ئەوه دیـارت نی‌یه؟ هەر ئێرنگه له کار تیەمەوە
ئیسه ۱ [ن] مقدار لا بأس به: بەش ئیسەیەگە
ئێسه ۲ [ئك] الآن، في هذا الوقت
ئیسەفا [ن] امعان النظر.
ئیسەفاگرتن [چ] الأمعان في: خاس ئیسەفای بگرێ زانی چه فەرقیانه.
ئێش [ن] الم، وجع: هێمان ئێش ها له لەشی
ئیشتر [ن] جمل
ئێشین [چ] التألم، التوجع
ئێغره [ن] تهدید، وعید
ئێغرەدان [چ] التهدید، التوعد
ئێل [ن] عشیرة
ئێـــلاخ [ن] الـمأوي الصیفي للرحـــل في المنـــاطق الجبلیه البارده
ئێلەك [تم] ئەلك
ئیمه [ر] نحن: کەس نی‌یه چنه ئیمه رەنج کیشا بۆی

ئينگه [ن] صوت رفيع
ئينگ وئانگ [ن] ١ صوت رفيع ومستمر ٢ ـ دلال (م)
**ئينگ وئانگ كردن** [چ] ١ ـ احداث صوت رفيع ٢ ـ الدلال.
**ئێواره** [ن] ١ ـ عصر ٢ ـ مساء
**ئێوان** [ن] أيوان
**ئێوه** [ر] أنتم، أنتن: ئێوه كیین؟
**ئێوەت** [ن] تربية، تنشئه
**ئێوەتکەر** [ن] مربي، مُنشيء
**ئێوەت كردن** [چ] التربية، التنشئه: كی ئێوەتی منالەگانت كێگ، پەس ئێوەت كردن زەحمەتە.
ه ١ [ئ] فعل الكينونه للفرد للغائب: جەلال زیلەکە
ه ٢ [پاش تضاف الى الأسم فتكون صفة: ژنان = ژنانه، كوران = كورانه.
**هڵ** [پاش] تضاف الى الكلمة للتصغير وتكون صفة: ڕوَت = ڕوَتەڵ. گرد = گردەڵ
ـ ب ـ
ب [ن] [بێ] الحرف الثاني من الألف باء
ب [پيش] تضاف الى المصدر فتكون ١ ـ فعل أمر: بكه ٢ ـ فعل أمر أو طلب غير صريح: بكەی ٣ ـ الصيغة الأنشائية: ئەگەر بهاتا. ٤ ـ تضاف الى جذر الفعل فتكون اسم الفاعل: بكەر. بخوەر

**با** [سر] صيغة مناداة الأب

**بابا** [ن] اب، والد (طفل).

**بابای عومر** [ذر] خالد: قابله نهمرێ، خوو بابای عومر نی‌یه.

**بابهت** [ن] موضوع ٢ ـ مسألة

**بات** [ن] له باتی: بدلا من، عوضاً عن: من له بالتی ئهو.

**باتمان** [ن] وحدة وزن تساوي ٢٨ كغم

**باج** [ن] ١ ـ ضريبة، رسم، مكس ٢ ـ خراج

**باجگر** [ن] جابی، محصل الضرائب

**باجگرتن** [چ] فرض الضرائب والرسوم ٢ ـ جمع الضرائب

**باجوای** [ن] رأس مال: باجوای سێ بار دێرم.

**باجوای كردن** [چ] وضع رأسمال: چەنێ باجواییان كردگه؟.

**باخ** [ن] بستان الأشجار

**باخەوان** [ن] بستانی

**باختیان** [چ] التغيير، التبدل: ڕەنگی باختیا

**باخچه** [ن] ١ ـ حديقة ٢ ـ بستان صغير، جنينه

**باخودا** [ئن] مؤمن، الذي يخاف الله

**باخودایی** [ن] كون الفرد مؤمناً وعادلاً. أيمان

**باد** [ن] ١ ـ هواء، ريح: بەختی فەقیر بادە یا باران [پەند] ٢ ـ مرض آلام المفاصل: ژان و باد داگە لە پشتی

**بادە** [ن] شراب، نبيذ، كحول، خمر

**بار** ١ [ن] ١ ـ حمل ٢ ـ ثقل ٣ ـ وضع، شأن: بارو وەزعی پڕە لە کامەرانی.

٤ ـ انتقال الى مكان آخر

٥ ـ قشرة تغطي الشفاه نتيجة لمرض كالحمىٰ مثلاً.

**بار** ٢ [پاش] تضاف الى الأسم فتكون صفه: خەفەت = خەفەتبار

أ ـ لە بار چوون [چ] الأجهاض، سقوط الجنين: ژنەی منالْ لە باری چگە.

ب ـ لە بار دان [چ] ١ ـ الأنتقال الى مكان آخر ٢ ـ التحميل والذهاب: شەوەکی ئەول گولْ سووا لە بار دان

**بارانە** [ن] ضريبه الحمولات: چەنی بارانە لیتان سەنن؟

**بارجە** [ن] بارجه، سفينه

**بارحە** [ن] قبض، حر شديد: وە ئیْ بارحە لە دەیشت وازی کەن.

**بارخانە** [ن] مخزن، مستودع الحمولات

**بارکەر** [ن] الذي يحمل الحمولات، الشاحن
**بار کردن** [چ] ١ ـ الأنتقال الى مكان آخر
٢ ـ التحميل، الشحن: هەزار گوونیە بار کردیم
**بارکوولّە** [ن] ١ ـ الحمل، المقدار الذي يحمله الشخص على ظهره: بارکوولەیەگ چیلگ ها وە کوولّیەوە.
٢ ـ كميه كبيره [م] یەك بارکوولّە نان هاوزد
**بارویت** [ن] كذب وبهتان: قسەگەت، گشتی باروبتە.
**بارووِد** [ن] ١ ـ بارود ٢ ـ كنايه عن الغضب: بوَە وە بارووِد
**باری** [ئن] قادر على حمل الأثقال [حيوان]: خەر چەرمك باریِیە.
**باریك بوونەوە** [چ] ١ ـ أن يصبح ضعيفاً ٢ ـ أن يصبح رفيعاً ٣ ـ أن يصبح ضيقاً.
**باریك کردنەوە** [چ] ١ ـ الأضعاف ٢ ـ جعله رفيعاً ٣ ـ التضييق
باریکی [ن] ١ ـ حالة كون الشيء ضعيفاً، رفيعاً أو ضيقاً: بەن لە باریکی برێگ، مەرد لە قایمی. ٢ ـ السهام: هزال مصاب بمرض مزمن.
**باریکیدار** [ئن] مصاب بالسهام

**بارییه** [ن] حصیر، باریه

**باز ۱** [ن] ۱ ـ طیر الباز ۲ ـ قفز: وثوب: وه یه‌ك باز په‌ڕیه‌و سه‌ری دیواره‌گه‌وه.

**باز** ۲ ـ [پاش] تضاف الى الأسم فتكون صفة: فیْلْ = فیْلْباز.چكره = چكره‌باز

**بازاڕ** [ن] ۱ ـ سوق ۲ ـ حالة السوق من بیع وشراء: بازاڕی قوماش گه‌رمه

**بازاركه‌ر** [ن] متسوق: كی بازاركه‌ردانه؟

**بازاڕ كردن** [چ] التسوق: چم ئه‌ڕا بازار كردن.

**بازاڕ گه‌رمی** [ن] دعایة، تهریج: بازاڕ گه‌رمی ئه‌ڕا سه‌رتیپ كه‌ن

**بازاڕگه‌رمی كردن** [ئن] الدعایة، التهریج

**بازاڕی** [ئن] ۱ ـ تجاری ۲ ـ عادي ۳ ـ ردیء: ئه‌و پارچه خاس نی‌یه بازاڕی‌یه.

**بازه** ۱ [ن] نوع من القماش

**بازه** ۲ [ئن] عقابی اللون، مخطط ومنقط بالسواد

**بازدان** [چ] الطفر، القفز، الوثوب: باز دا وه سه‌ری دیواره‌گه‌یه‌وه.

**بازرگان** [ن] تاجر

**بازرگانی** [ئن] تجاری، خاص بالتجارة

**بازرگانی كردن** [چ] ۱ ـ الاشتغال في الاعمال التجارية ۲ ـ المتاجرة

**بازقەپان** [ن] حیه قافزه، حیه تقفز وتثب

**بازگ** [ئن] ١ ـ عنابی اللون ٢ ـ أعشم، أبلق

**بازگەردان** [ن] أنتخاب الملك عن طريق اطلاق باز على مجموعة من الناس ويفوز الذي يحط الطير عليه

**بازگ بوونەوە** [چ] ١ ـ أن يصبح عنابي اللون. ٢ ـ الأنكشاف، : هەر رووژێ تیێ بازگ بووگەوە. الظهور ٣ ـ أن يصبح اعشم، أبلق

**بازگ کردنەوە** [چ] ١ ـ بلق (العين) ٢ ـ الكشف، الأظهار: بازگی مەکەرەوە.

**بازگی** [چ] ١ ـ كون اللون عنابي ٢ ـ كون (العين) أبلق. أعشم

**بازمە** [ن] دلوه، أكله تعد من الحليب الخاثر

**بازنە** [ن] رقاص الساعة

**بازنگ** [ن] حلقة زينه تلبسها الفتيات في العيد

**بازوو** [ن] ١ ـ عضلة ٢ ـ عضد

**بازوودار** [ئن] ذو عضلات قوية

**بازی** [تم] وازی: بازی کووتان خوەشە

**بازیکەر** [تم] وازیکەر: سەروەر بازیکەری تووپانە

**بازی کردن** [تر] وازی کردن: منالەگان لە دەشت بازی کەن.

**بازیوەن** [ن] سوار من القماش يحتوى على تعويذه

يشد على الزند دفعاً للشر.

**بازيوەچان** [ن] مآقه: أن يشتد بكاء الصبي ويأخذه النشيج

**بازيوەچان كردن** [چ] المآقه: المادة السابقة: بچوو فەرمان بازيوەچان بكەی!

**باس** [ن] ١ ـ حديث، كلام ٢ ـ قصة ٣ ـ اخبار

**باسكەر** [ن] ١ ـ متحدث ٢ ـ راوٍ

**باس كردن** [چ] ١ ـ التحدث ٢ ـ رواية القصص والأخبار

**باشققه** [ئن] ممتاز، أفضل، أجود، أرقىٰ، أحسن: ئەو میەی پەڕە باشققەی گشتیانه

**باغه** [ن] باغه

**بافه** [ن] شماله، باثه: باقه من الزرع المحصود

**بافەونان** [چ] جمع الشماله، باثه

**بافەو نەر** [ن] جامع باثه

**بافت** [ئن] أجوف، جوفاء: ئیٚ چووه بافته

**بافتی** [ن] كون الشيء أجوفاً، جوفاء

**باقه** [ن] حزمه، ربطه باقه

**باقلله** [ن] حبة الباقلاء، نبات الباقلاء

**باك** [ن] ١ ـ خوف: هەر باكی له كەس نی‌یه ٢ ـ هم: هیچ باكت نی‌یه له منالّەگانت.

**باك كردن** [چ] ١ ـ الخوف من ٢ ـ الأهتمام

**باڵ** [ن] ١ ـ ساعد، زند، ذراع ٢ ـ جناح ٣ ـ ردن ٤ ـ جهة:

له چوار باڵا هاتن ٥ ـ باع

ـ له شەقــەی باڵ دان [چ] الطيــران: کەوەگــە دا له شەقەی باڵ.

**باڵا** ١ [ن] ١ ـ قامة ٢ ـ فطر يحدث تحت اصبع القدم، يعتقد الناس أنه دليل الطول والقامة

**باڵا** ٢ [ئن] أعلىٰ: باڵا جوو

**باڵا بەرز** [ئن] طويل القامة

**باڵا بەرزی** [ن] كون القامة طويلة

**باڵا خانه** [ن] ١ ـ عمارة ٢ ـ ناطحات السحاب

**باڵا كردن** [چ] أن يمتد قامته: ماشەڵلا، کورەدان وه یەکجا باڵا کرد.

**باڵان** [چ] طيران، الطيران الجوي

**باڵه** [ن] باله، حزمة: پەنجا باڵه گوێش سەنگه.

**باڵــەکـەو** [ن] مرض يصيب أجنحـة الطيـور فيحيلهـا زرقاء اللون ويفقد الطير المريض قابيلية الطيران

**باڵباز** [ن] عسكر، يلبسون الملابس المدنية ويضعون علامــة مميـزة على أذرعهم لتميـزهـم عن المـدنيين، وتوسعا: شرطي

